پێنجەم: منەت کردن، قورئان دەفەرموێت﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى﴾ البقرة/ واتە: خێر و چاکەکانت بە هۆی منەتکردن و ئازاردانەوە بەتاڵ مەکەنەوە.

شەشەم: حەسوودی، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت (الحسد يأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب) ئەبوداود. واتە: حەزکردن بە نەمانی ناز و نیعمەتی خەڵکی چاکەکانی مرۆڤ دەخوات هەروەك چۆن ئاگر دار دەخوات و دەیسوتێنێت.

حەوتەم: سێ لەناو بەری تر، خۆشەویست (د.خ) لەبارەیانەوە دەفەرموێت (ثلاث مهلكات، شح مطاع، وهوي متبع، واعجاب المرء بنفسه) واتە: سێ شت مرۆڤ دەفەوتێنێت، چرووکیەکی ملکەچ بۆ کراو، ئارەزوویەکی بە گوێ کراو، لە خۆ ڕازی بوون و لە خۆ بایی بوون.

## دوا وتە

یەکەم/ زانای خۆراکی ئەمریکی (ئەندریا ویل) لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئەو وتەیەی عائیشە کە دەڵێت ئێمە سێ هیلالمان دەدی (واتە هەشت هەفتە) وە ئاگر لەماڵماندا نە دەکرایەوە و لەسەر خورما و ئاو دەژیاین، ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەی لە پەڕاوێکدا نووسی بەناوی (هەشت هەفتە بۆ گەیشتنە تەندروستیەکی زۆر باش) وە تیایدا باسی شێوازی خواردنی حەزرەتی کرد کە ئەو پەڕی تەندروستی تیایەو سەرنجامیش مسوڵمان بوو (بلا حدود ٢٠٠٢/١٢/٢٤ الطب الحديث و استخدام الغذاء) .

دووەم/ باڵوێزی ئیتاڵیا لە سعودیە (کاردیلی) یش مسوڵمان بوو، لە تەمەنی ٥٩ ساڵیدا، ناوبراو سی و سێ ساڵ لە بواری دیپلۆماسیدا کاری کردووەو دەڵێت (قەناعەتی تەواوم پەیدا کردووە بە ڕاستی و تەواوی پەیامی پیرۆزی ئیسلام، بەهۆی خوێندنەوەی قوڵی قورئانی پیرۆزەوە) ...

سێهەم: جل نمایشکەری یۆنانی (ماکلین سیکاروس) یش ڕۆژنامەنوسێکی جەزائیری پرسیاری نمایشکردنی پۆشاکی ئیسلامی لێکرد، ئەویش باسی ئیسلامی نەبیستبوو، بۆیە داوای لێکرد کە باسی ئیسلامی بۆ بکات، کاتێك لە گەورەیی ئیسلام شارەزا بوو مسوڵمان بوو مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند..

چوارەم/ پرۆفیسۆر (زەغلول نەجار) دەڵێت پزیشکێکم بینی لە هامبۆرگ لە ئەڵمانیا بە خوێندنەوەی پەڕاوی پرۆفیسۆر (کیث مور) مسوڵمان بوو کە باسی کۆرپەلە ناسیەو ئاماژەشی تیایە بۆ ئیعجازی عیلمی قورئان لەو بوارەدا. بەڵێ ئەم ئاینە زیاتر لە هەموو کات توانای کەمەندکێش کردنی خەڵکی هەیە و مایەی سەرفرازی دنیا و قیامەتە، چونکە گشتگیرە و هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکردووە و بڕوای بە هەموو پێغەمبەرانە..

ڕۆژێك شێخ محمد عەبدە لە کۆڕێکدا کە گاور و جولەکەش ئامادە بوون تیایدا پرسیاری لێکرا لە بارەی چوونە بەهەشتەوە، ئەویش وتی ئەگەر جوولەکە بە ئیمانیان بە موسا بچنە بەهەشتەوە ئەوا ئێمەش ئیمانمان پێیەتی ودەچین، ئەگەر گاورەکانیش بە ئیمانیان بە عیسا بچنە بەهەشتەوە ئێمەش ئیمانمان پێیەتی و دەچین، بەڵام کە ئێمە بە ئیمانمان بە محمد بچینە بەهەشتەوە، ئەوا ئەوان هیچیان ناچنە بەهەشتەوە..

دەڵێن:ڕۆژێك خۆرو ڕەشەبا دەمەقاڵێیان دەبێت لەسەر ئەوەی کە کامیان دەتوانن پاڵتۆیەك بە پیاوێك لابەرن، خۆر لە پاڵ هەورێکدا خۆی دەشارێتەوە و ڕەشەباش گفەی دێت و هەرچی دەکات کابرا زیاتر پاڵتۆکە لە خۆیەوە دەپێچێت، ئنجا خۆر سەردەردەهێنێ و لەسەرخۆ و هێدی هێدی کەش و هەواکە گەرم دەکا و، تا کابرا ناچار دەکات پاڵتۆکە لەبەری دابکەنێت..بەڕاستی ڕەوشت و خووی خراپیش هەروایە و دەبێت بانگخوازان بە بەرنامەو بە ژیری و لەسەرخۆ پشت بەخوا هەوڵی گۆڕینی بدەن..

# سەرچاوەکان


١. گولآوی سەرمۆر _المباركفوری

٢. الحرص على هداية الناس – فضل الهی

٣. گۆڤاری الايمان ژ ٢٠٠٢/١٢/١١

٤. نحو التفسير الموضوعی للقران – محمد الغزالی

٥. التوغل مسالك – الراشد

٦. الاعجاز الالهی فی أجهزة المناعة والمقاومة فی جسم الانسان –د. محمد السيد الارناؤوط

٧. الدعوة الى الاسلام – سير توماس أرنولد

٨. حدد غايتك – عمرو خالد

٩. برنامج بلا حدود (الطب الحديث واستخدام الاغذية) (المسيحية الصهيونية)

١٠. روائع من السيرة _عائض القرنی

١١. برنامج مواجهات قناة اقرأ.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

١- بەرەو پەروەردەی ئیسلامی

٢- بەرچاوڕوونی

٣- فەرهەنگی بانگخوازان

٤- لە خزمەت قورئاندا

٥- بەهاری دڵان

٦- ژیانەوە

٧- بەرەو ئیسلام

٨- رازی قورئانی

٩- هەزارویەك

١٠- هەزارو دوو

١١- زەوق و سەلیقەی بڕوادار

١٢- رامان لە قورئان

١٣- وەڵامە زانستیەکان (بەشی یەکەمی قورئان پارێزراوە )

**بەرهەمەکانی نووسەر کە ئامادەن بۆ چاپ:**

١-سلاّو لە فریشتەکان ، کەباسی دوا هەناسەی سالّحانە لەو کات وساتەی مالّئاوایی لە دونیا دەکەن .کەئەوەش دەبێت هەموومان کاری بۆبکەین و ، بترسین لەو رۆژەی لە بەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان رادەگیرێـین (أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ (٤) لِيَوْمٍ عَظِيمٍ (٥) يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٦)المطففين..

٢- کەشکۆلّ : کۆمەلّە بابەتێکی ئیمانیە .

٣-هەمەڕەنگ : ئەمیش کۆمەلّە بابەتێکی ئیمانیە..کە ئەمانە هـەموویانم لـە فـەیس بووك بلاّوکردۆتەوە.

٤- گەشـتی ژیـان :کەسـانێك هـەن دێنـە دونیـاوەو دەیـان سـالّ دەژیـن و کاتێـك مالّئاوایی دەکەن هیچی وایان نـەکردووە شـایانی بـاس بێـت و هیچیـان لـە ژیانـدا زیـاد نەکردووە ، دیارە کەسانێکیش هەن رۆلّی باش دەبینن و دەبنە سەرمەشق بۆ ئەوانـەی دەوروبەریان و نەوەکانی دوای خۆشیان ، مـن هـەولّم داوە تیشـك بخەمـە سـەر ژیـان و هەلّوێستی چەند کەسایەتیەك وەك (دکتۆر منیر غەزبان کەخزمەتێکی گەورەی بەژیانی سەروەرمان کرد، هەروەها چەند کەسایەتیەکی تری کوردوستان و ولاّتانی دەرەوە )کە پشت بەخوا دەبێتە مایەی بەرچاو رۆشنی وگەرموگوڕی زیاترلە دینداریدا ..

ئەو نووسینانەی بەندە رەنجی زیاتر لە چل سالّ تەمەنەو هـەموویان یـەکتری تـەواو دەکـەن و باسـەکان ئیمانیـات و قورئانیـات و باسـی بانگـەوازو ئیعجـازی قورئـان و فەرموودەیە .

سوپاس بۆخـوا خـەلّکانێکی زۆر سـوودیان لێبینیـوە، بـەهیوای دوعـای خێرتـان تـا بەیەککەیشتنەوەیەکی تر بەخواتان دەسپێرم..

## ناومرۆك